# حکومی هێنانەوەی مەنی بەدەست

# ( الاستمناء )

## لەفقهی ئیسلامی و زانستی پزیشکیدا


ن/موحەممەد حەسەن سەرگەینێلی





پێداچوونەوەی
یونس مەلا مصطفی چیوەیی



یەکەم چاپ
هەولێر ٢٠١٠

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : حوكمی هێنانەوەی مەنی بەدەست (الاستمناء)

بابەت : کۆمەڵایەتی

نوسینی : مەلا محمد حسن سەرگەینێلی

پێداچوونەوەی : مامۆستا یونس مەلا مستەفا چیوەیی و زیومر انور

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا

چاپ : یەکەم / ٢٠١٠

شوێنی بلاوکردنەوە: کتێبخانەی حاجی قادر ی کۆیی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٤٩)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.

بلاوکراوەی کتێبخانەی

**حاجی قادری کۆیی**

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

هەولێر کوردستان عیراق

(٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ - ☎ - ٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨)

# حوكمی هێنانەوەی مەنی بەدەست
## (الاستمناء)
## لە فیقهی ئیسلامی و زانستی پزیشکی دا

نووسینی

**مەلا محمد حسن سەرگەینێلی**

پێداچوونەوەی

**مامۆستا یونس مەلا مستەفا چیوەیی**

**زیـــومر ئەنـــوەر**

٢٠١٠ز- ١٤٣١هـ

هەولێر

# پێشەکی

**بسم الله الرحمن الرحیم**

بێگومـــان (جـــنس-زایـنـــدەیی –Sex) غـــەریزەیێکی زیـنـــدوو بالادەستە بەســـەردەروونی مرۆڤـدا، دوای خـواردنو خواردنـــەوەو هـــەوا هەڵمژین بەگرنگترین غـــەریزە دادەنرێـــت، چـــونکە پـــارێزەری مانـــەوەی زیندەورانو رووەكو گیاندارانە لە زەوی دا، بـــێ جـــنس ژیـــان قـــڕی تـــێ دەکەوێت. لە بـــەرگرنگی ئـــەم غریزەیـــە ئیـــسلام هـــاتووە ڕێو شـــوێنی تایبەتی بۆ داناوە، نابێ کپ بکرێتو سەرکوت بکرێت، نابێ جلەویـشی بەرەڵا بکرێت، لەهەردوو لادا زیانی دەروونیو جەستەییو کۆمەڵایـەتی دروست دەکات. ئەو کەسەی جلەوی جنسی بـــەرەڵا دەکـــات وەکـــو ئـــەو شوفێرە شێتەی لێ دێت کە گوێ بـــە ڕینماییـــەکانی پۆلیـــسی هاتووچـــۆ نادات‌و داهاتووی خۆیو خەڵکیش دەخاتە مەترسیەوە.

گەر بەرەڵا بکرێو لە کۆمەڵگادا رەهابکرێ دەیان نەخۆشیو دەیان لادانی جنسیو دەیان دیاردەی دزێوو زیانبەخـشی کۆمەڵایـەتی پەیـدا دەکـــات. بۆیـــە ئیـــسلام داوای داوێـــن پـــاکی (العقـــە) دەکـــات بـــەر لـــە هاوسەرگیری. ئەنجا داوا دەکـــات وەڵامدانـــەوەی سێکـــسی لـــە ســـنووری هاوسەرگیری دەرنەچێت. ئەم پرۆسەیە بە زوویی هەوڵی بۆ بدرێت.

ئەم داوێن پاکی‌و هاوسەرگیری یە رێگا چارەی سروشتی بۆ پاراستنی تاك‌و کۆمەڵگا لە نەخۆشیە گشتی یەکان‌و نەخۆشییە جنسی یەکان.

(ئاو هێناوە بە دەستیش) یەکێکە لەو دیاردەو لادانە جنسی یانەی کە لە لایەن پۆلێ لە ئادەمیزادا ئەنجام دەدرێ. بۆ وەڵامدانەوەی جنسی‌و کەم کردنەوەی فشاری جنسی‌و چێژ وەرگرتن لەبریتی هاوسەریدا، ئەوانەی ئەو کرانەش دەکەن بەزۆری سەڵتەکانن‌و ئەو کەسانەن کەخوویان پێوەگرتوەو مودمین بوون پێیەوە. ئەم دیاردەیەش کاردانەوەی خراپی هەیە بۆ سەر تەندروستی گشتی‌و تەندروستی سێکسی، بۆیە بڕیارماندا لەم نامیلکەیە دا تیشکێ بخەینەسەری‌و بیکەینە پەیامێك بۆ تاکەکانی کوردەواریمان، بەو هیوایەین سوودی لێ ببین‌و ڕێنوما بەخش بێ بۆیان، هەم لەڕووی شەریعەتەوە، هەم لەڕووی نوژدارییەوە.

**نووسەر**

**٢٠٠٩/٦/٦**

**چیوەی سەرێ**

## بەرەو رێبازێكی پەروەردەیی دروست

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾[1].

واتە: ئەی خەڵكینە خۆتانو خێزانتان لە ئاگر بپارێزن. پێشەوا علی (س) دەفەرمێ: ﴿أي ادبوهم وعلموهم ﴾[2]. واتە منداڵەكانتان پەروەردە بكەنو فێریان بكەن.

خوای گەورە باس لە قۆناغی گرنگی پێ گەیشتن دەكات، وە باس لە قۆناغی هەرزەكاری (المراهقة) دەكات كە پەیڕەوێكە بەسەری دا گوزەر دەكات، كە قۆناغی منداڵی یەوە بۆ قۆناغی لاوی‌و پیاوێتی.

دیسان تاكی مێیینە تێیدا لە قۆناغی منداڵی یەوە پێدە دەگاتە قۆناغی گەشەكردنی مێینەیی.

﴿وَابْتَلُواْ الْيَتَامَى حَتَّىَ إِذَا بَلَغُواْ النِّكَاحَ﴾[3]،

واتە: هەتیوان تاقی بكەنەوە تا كاتی مارەكردنیان یێت. (النكاح) واتە (البلوغ).

﴿واذا بلغ الاطفال منكم الحلم فليسأذنوا ﴾[4].

---

([1]). سورة التحريم / ٦.

([2]).تفسير القران العظيم، ابن كثير / ج٤: ل: ٥٠٢.

([3]). سورة النساء/٦.

([4]) سورة النور/٥٩.

واته: کاتێك منداڵانی ئێـوه شـەیتانی بـوون بـا داوای روخـسـەت بکەن بۆ هاتنە ژوور. بەو پێیەی لـەکاتی هـەرزەکاریو بـالغی دادەبـێ پەروەردەی جنسی بکرێت. بێگومان گۆڕانە جنسیی یەکان کـە بەسـەر هەرزەکاری وکوڕو کچدا دێ زۆر خەمی پێوە دەخواتو دەبێتە سۆنگەی داڵغەو بیرکردنەوە کانی. زۆر جار توشی دڵەڕاوکێو تـرس دەبـێ، گـەر پەروەردەیەکی جوانی نەکرێو ئاشنا نەکرێ بە پەروەردەی جنسی، ئـەوە توشی لادان دەبێت ئەرکی سەرەکی ئەم پەروەردەیەش دایـكو باوکـانن، ئەو کاتە پێویستی زۆر بـەکارزانیو سـۆزی بـاوان هەیـە، هـیچ شـتێ جێگای کارزانیو سۆزی ئەوان ناگرێتەوە.

لەهەموو مەترسییەکان گەورەتر مەترسی غەریزەی سێکسی یـە، بە تایبەتی لە هەلو مەرجی دنیایی ئیمڕۆی بەرەڵایی جنسی. دا یـەکێ لەو مەترسـییانەش گـەنج تێـی دا تووشـی لادان دەبـێ، نـەریتی ئـاو هێنانەوەیە (الاستمناء)، کـە قورئـانو سـوونەتو زانـستی پزیـشکی دەروونی بە مەترسیداری دەزانێت.

سەرباری ئەوەش سەر دەکێشی بۆ لادانی جنسی ترو زینـاو داوێـن پیسیو خراپەکاریەکی تر، ئەنجا تووش هاتنی بە نەخۆشـیە جنـسیەکان وەکو فەرەنگیو سۆزەنە ....ئایدز. (جیمس رستون) دەڵـێ: (مەترسـی

وزەی سێکسی لە دهاتوودا لە مەترسی وزەی ناوکی زیاتر دەبێت)[٥].

وەکو لە کتێبی (ڕێنومایی سێکسی ئیسلامی دا )باسمان کردووە.

(پەروەردە) وشەیێکی قورئانییە: ﴿إنه ربي أحسن مثواي﴾[٦].

لێرەدا یوسف عەزیزی میسری بە(الرب) ناو دەبات، واتە: پەروەردەکەرو مشوور خۆر.

## پێگەیشتنو (البلوغ) نیشانەکانی بۆ کوڕانو کیچان

گرنگترین ڕووداو لە ژیانی مرۆڤ دا پێ گەیشتن (البلوغ)ە، کەتاك تیایدا دەگاتە قۆناغێکی تازەو گۆڕان و وەرچەرخانو چالاکی تێدا ڕوودەدات مندالٚ سەردەمی مندالٚی تێدا بەجێ دەهێلێت گەشەکردنیو گەیشتنی جنسی دەستپێدەکاتو ڕو لە تافی پیاوەتی دەکات، کچ دەکەوێتە خوێنی بێ نوێژی بەمە توانای دووگیانیو مندالٚ بوونی هەیە، کوڕ توانای شەیتانی بوونو ژن هێنانی هەیە.

هۆرمۆنەکان لەوانە (کوێرە ڕژێنەکان) دەست بەچالاکی دەکەنو سیفەتە لاوەکییەکان دەردەکەون.

کچان لە (٩-١٥) سالٚی دا پێ دەگەن. لە وڵاتی (لا بۆنیادا) کچ

---

([٥]).العادة السرية/ عبدالله حمدان ، ل. ٦.

([٦]). سورة يوسف/٢٣.

بە (١٨) ساڵی و لەوڵاتی حەبەشەدا بە (٩) ساڵی کچ پێ دەگەن، دیسان زۆر هۆکاری تر ئەم بالغی بەپێش دەخات وەکو فیلمی رووتو وێنەی رووتو تێکەڵاوی کوڕو کچ، دیسان کەش وهەواو رەگەز. لە ئەمریکادا کچانی رەش پێستی هیندی پێش ئەمریکیە سپی پێستەکان توشی بالغی دەبن، بۆ زانستی پتر بڕوانە (سن المراهقە/ مۆریس دویس)[7].

کچان لە قۆناغی پێ گەیشتندا مەمکەکانیان دەست بە گەشە دەکەنو حەوزیان فراوان دەبێ، بەز (پیو) دایدەپۆشی، هەروەها رانەکانیان گۆشتن دەبنو شێوەی مێ یینەیی وەردەگرن. مووی بانەگاو بن هەنگڵی دەست بە گەشە دەکات. هێلکەدانەکانی چالاك دەبن، ئەندامانی زاووزێ ی دەرەوەو ناوەوە دەست بە گەشە دەکەن. گرنگترین نیشانە ئەوەیە، کە هیلکە دانی ئافرەت توانای دەردانی هۆرمۆنی ئەسترۆجینیو پرۆجیستیرونی هەیەو هەموو مانگێ هێلکەیێك دەردەچوێنی بۆ پیتاندن. لە گەڵ ئەوەدا خوێنی بێ نوێژی دەردەکەوێ، کە نیشانەی گەورەی پێ گەیشتننی کچە، بەڵگەیێکە توانای شووکردنو دووگیانیو منداڵ بوونی هەیە.

هەرچی کوڕەکانن لە (١٢-١٤)دا بەپێی کەشو بۆماوەو رەگەزو

(7). سن المراهقة/ ت: سمير ارسلان، ل. ٢٨-٢٩. بیخوێنەوە.

تەندروستیو ژینگەو توانای بایۆلۆجی ئەم بالغی یە هەندێ پێشو پاش دەکەوێت. لەکاتی بالغی هۆرمۆنی (تسترستیرون) بەرهەم دێو زۆربەی نیشانەکانی دەردەکەوێت.

لە پێشترین نیشانەکانی کە بە نیشانەی لاوەکی (الثانوي) ناسراون ئەمانەن:

دەنگی لاوەکە گەر دەبێو دەنگی منداڵێتی دەگۆڕێو هەندێ دەنگی پیاوەتی وەردەگرێت، مووی ریشو سمێڵو بانەگاو مووی بن هەنگل دەردەکەون ، بە گشتی لاو لە ماوەی بالغی دا گەشەی زیادەکات چوارپەلەکانی قەبارەیان گەورتر دەبێ/ نیشانەکانی دەمو چاو بەدەردەکەونو وەتەکانی گەورە دەبێ، تۆواوەکانی لە وەتەکاندا دەست بە دەوران دەکەنو لە شێوەی خەونی شەیتانی (الاحلام) بووندا دێنە دەرەوەوە لەگەڵێ دا هەست بە چێژی جنسی دەکات.

وەکو (د. عبدالحسین بیرم) لە (الجنس) ئاماژەی پێکردووە خەونی شەیتانی بوون نەستی (اللاشعور) ییە، بەهۆی کۆبوونەوەی تۆوەکان لە توورەکەکانی تۆوی دا دروست دەبێت، نموونەی وەکو تەقینەوەی کانیاوێکی ژێر زەوییەکانی بەهۆی کۆبوونەوەو کەڵەکەبوونی لە درزێکەوە هەڵ وەردەگرێتو دەردەپەڕێت. وەکاتێ لاو دەست لە تۆلی خۆی دەدات هەست بە چێژی جنسی دەکات.

وه هەروەها کچ کاتی بالغ دەبیٚو دەست لە ئەندامانی زاوزیٚ ی دەدات، رژێنی (بارپولین)ی دەست بە دەردانی لینجاوەکان دەکات، کە بەلینجاوی زیٚ (الافرازات المهبلیه) ناسراوه. ئەم ئاو هاتنەوەیە بۆ کچان وەکو ئاو هاتنەوەی کوڕانی بالغه.

زۆر دیاردە هەیە یارمەتی ورووژاندنی جنسی دەدات، وەکو تێکەڵاوی کوڕو کچو بینینی فیلمی رووتو خوێندنەوەی چیرۆکی خۆشەویستی، یان خۆراکی چەورو تیژ وەکو گۆشتو بیبەرو شتی تر. ئەم دیاردانە جنس دەورووژێنیو هەرزەکار سوراغی ئەوە دەکات رێگایەك بۆ بە تاڵ کردنەوەی ئەو هەوەسو ئارەزوو، بدۆزیتەوە، کە بە ناو هێنانەوەیە بەدەست (الاستمناء-العاده السریه) ناودەبرێت.

هەروەها کچیش شەیتانی دەبنو زۆری لە کچان ئەم دیاردەیە دەبینن، کاتیٚ لە خەو هەڵدەستن بەرگی ناوەیان تەڕ کردووه، کە بریتی یە لە ورووژاندنی (بارتۆلین)، بەڵام وەکو سپێرمی پیاو پیێنەر نیە، ئەم شەیتانی بوونەی کچانیش، نە ئاونگەکانی تری زیٚ کارناکاتە سەر پەردەی کچێنی.

بێگومان لە کچان هەیە ئارەزووی جنسی یان بەهێزە کە بەشەبەقی جنسی ناسراوەو زۆربە دژواری ئارەزوویان دەشکێت. بەڵام گەر ئەو کچانە واقعی یانە بیربکەنەوە، خۆ لە تەنیاییو بێکاری

بپارێزین‌و نوێژ بکەن‌و ڕۆژو بگرن‌و خۆیان لەو شتانە بپارێزن کە ورژێنەری جنسین، دەتوان لە توانایەکەی کەم بکەنەوەو دۆخی ئاسایی وەربگرێت.

لە کچان هەیە دەوروبەری ئەندامی زاوزێ ی تووشی ئالۆش‌و خوران (الحکە). دەبێ، کە هۆیەکەی تەنینەوەیە بە (تینیا)، یان خروی پیستەیان باری(ئەر تیرازما) یان هەوی پێستی دروستی دەکات، بەلاّم زۆربەی هۆیەکەی (تینیا) کە هەوێکی کەروویی (الفطریات) یە بەهۆی پەرۆو ئاوی پیس دەگوازرێتەوە[٨].

## حوکمی ئاو هێنانەوە لە فیقهی ئیسلامی دا

(د. وهبە الزحیلی) دەنووسێ: (بەپێی ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ ملومين﴾[٩]، ئەنجامدانی حەرامە، چونکە ڕاستە خۆ بڕینی وەچەیە، بکەرەکەی تەمبێ دەکرێ‌و حەددی لێ نادرێ، چونکە کردارێکی جنسی یە بەبێ بوونی شەونگەیێك (الفرج)[١٠]،

---

([8]). بەکورت کردنەوەو دەستکاری لە (العادة السرية / عبدالله حمدان) وەرگیراوە.

([9]). سورة المعارج، الاية (٢٩-٣٠).

([10]). الفقه الاسلامي وادلته. د. وهبة الزحيلي، ج ٧، ل: ٥٣٤٨.

(د. احمد محمد کنعان) دەنووسیّ:

(الاستمناء : Mastorbation) بەناو هێنانەوە یان پەڕین بەدەست ناوی هاتووە، بەڵام (ئاو هێنانەوە) لەرووی رەویشتو نەریتەوە جوانترە بەکاربێت: بریتی یە لە ئاو هێنانەوە بەبیّ کرداری جووت بوون (ألجماع)، بۆ ئافرەتو پیاو دێتە دی، بە دەست یان شتی تر دەبێت، بە بیرکردنەوە، یان بەسەیر کردنیش دەبێت، ئاو هێنانەوە تەنیا لەبەر کرداری شەهوەتی تێکردن حەرامە، لەهەندیّ لەرایەکانی حەنەفیو حەنبەلیو شافعی دا هاتووە (مەکرو هەبەتە نزیهی)، بەڵام گەر بۆد امرکاندنەوەی شەهوەتێکی زۆربیو ترسان هەبوو لە تووش بوونی بە زینا ئەوە دروستە، لێرەدا گەر لە گەڵ زینادا بەراوردبکریّ ئاو هێنانەوە زیانی کەمترە زۆر لە زانایان بە دروستیان زانیوە ژن بۆ مێردی خۆی ئاوبێنێتەوە، چونکە شوێنی چێژی ئەوە، هەندیّ بە مەکروهی دەزانن.

ئاو هێنانەوە بەدەست رۆژوو دەشکێنی بەڵام کەفارەتی لەسەر نیە، چونکە رۆژو شکاندنە بەبیّ جووت بوون، بەڵام لای مالکی گرتنەوەو کەفارەتی واجبە. لای حەنەفیەکان وشافعی یەکان لای کەمێکیان نەبیّ ئاو هاتنەوە بە سەیرکردن رۆژوو ناشکێنی وەکو شەیتانی بوونە، بەڵام لای حەنبەلی یەکان دەشکیّ چونکە دەتوانریّ خۆی لیّ بپارێزرێت. بەڵام بە دالغەو بە چاوو خەیاڵ ئاو هاتنەوە بەتاڵ دەبێتەوە. ئاو هێنانەوە لە حەجدا حەج بەتاڵ ناکات بەڵام قوربانی

دەوێ، بەڵام لای مالیکی حەج بە تاڵ دەکاتـەوەو قـەزای دەوێو دەبـێ خوێنیش بدات، هەتا ئەگەر لە یادیشی نەبێت، چونکە هۆیەکی حـەرام کراوە.

ئاو هێنانەوە غوسلی دەوێ بۆ ژنو بـۆ پیـاو، مەبەسـت لـە ئـاو هاتنەوە بۆ ژن ئەوە یە ئاوەکەی بۆ شەوڵگە دابەزێ کە لـەکاتی دەسـت بە ئاوگەیاندن دەیشواتەوە، بەڵام ئاو هاتنەوە بەبێ چێژو شەهوەت تەنیا لای شافعی غوسلی دەوێ، لای مەزهـەبی تـر دەسـت نوێـژ گرتنـەوەی دەوێت [11].

## (ئاوی پیاو) -semen (المنی)
## ئاوی ژن لە فیقهی پزیشکیدا

ئاوی پیـاو: شـلەیێکی جووتەوەتـەکانو سیکڵدانۆچـکەی تـۆویو گلاَنـدی پرۆسـتات بەشـداری دەکـەن لـە دروسـتکردنی دا، خـاوەنی کارلێکردنەوە مەیلی تفـتی (قەلـەوی) دەکـات، ئـەم تفـتی یـەش بـۆ هاوسەنگی کردنـی ترشـە لـۆکی (الحموضـیة) زۆر گرنگـە کـە لـە زێ (المهبل) دایە. تـۆوی پیـاو (ألنطفة) کـە جووتەوەتـەکان دەری دەکـەن. ماددەیەکی سەرەکی یە لە ئاوی پیاودا، ئاوەکەی ترشـەلی پرۆسـتاتیو

(11). الموسوعة الطبـية الفقهية، د. احمد محمد كنعان، ل٨٦٧-٨٧٠ بەدەستكاریـیەوە

سیکلّدانۆچکەی تۆوی دەری دەدەن، پیاو لە یەك فیچە دا (الدفق) زیاتر لە (٣,٥سم ٣) ئاو فریێ دەدەن کە (١٠٠-٧٠٠) ملیۆن سپێرم (النطفة) ی تێدایە، پێویستە پیاو لە فیچقەی یەکەمدا سپێرمەتەن(٢٠) ملیۆن زیندەوەری تێدابێ تا توانای پیتاندنی هێلکۆکەو منداڵ بوونی هەبێت. کەم وایە لە خوار ئەم ژمارەیە منداڵ پەیدا ببێت. هەرچی مەزیو وەزییە لەئاوی پیاو دەچن، مەزی ئاوێکی روونی سپی باوە لەکاتی شەهوەتو یاری جنسیدا دەرچێت. بەڵام وەدی ئاوێکی لینجی خەستی سپی یە، بەبێ شەهوەت لەگەڵ میزدا دەردەچێ.

لای حەنەفیو مالکی تۆووی پیاو پیسە، بەڵام لای شافعی خاوێنەو سوونەتە شوردەبێتەوە، حەنەفی دەڵێ گەر وشك بوو دەگوشرێت، لای مالیکی بەبێ شوشتنەوە خاوێن نابێتەوە.

هەرچی (مەزیووەزییە ) حوکمیان حوکمی میزە نەك تۆو ، دەست نوێژ دەشکێننو غوسل واجب ناکەنو شوێنی توش هاتوو دەشۆردرێتەوە. بەڵام هەرچی ئاوی ژنە، ئاوێکی روونە بە فیچق دەرناچێ پارێزلین دەری دەدات لە دەوری زێدا و زێ تەڕ دەکاتو پاکژی دەکاتەوە لە میکرۆبو لینجی دەکات بۆ ئاسان کردنی کاری جووت بوون. تەنیا کاتێ پەیوەندی بە کۆرپەلەوە هەیە، مانگانە هێلکۆکەیەك دەردەدات ) [١٢].

---

([12] ).الانحرافات الجنسية، جمال صادق مردان ، ل ٦٣، ٧٤، بە دەستكاريیەوە. (٣) متفق عليه.

## - هۆیەکانی سەرهەڵدانی ئاوهێنانەوە:

ئاو هێنانەوە بە دەست لە ڕووی دەروونزانیـەوە لادانێکـی جنـسی یە، بریتی یە لە (کرداری جنس کردن لە گەڵ خۆدا-یـان چـێژ وەرگـرتن بەبێ پەیوەندی جووت بوون) (١٣).

ئاو هێنانەوە سێ جۆری هەیە، هەیە هزریە، یان بـە دەسـتە، یـان بەهۆکاری ترە وەکو بەکارهێنانی قامكو مۆمو هۆکاری تر کە بـە زۆری لای ژنان بەکاردێت، ئەم ڕێگایانە ئازار بە ئافرەت دەگەیەنن‌و هەو پەیدا دەکەن.

هۆکارەکـان زۆرن کـە ئـاو هێنانـەوە دروسـت دەکـەن، وەکـو کۆبوونەوەی تۆوەکان، شەیتانی بوون، فیلمو وێنەی رووت، سـەیرکردنی بەشەهوەتەوەو خۆراکی چـەورو ورژێنـەر، تـەنیایی‌و تێکـەڵاوی لەگـەڵ ڕەگەزی تردا.

-ئەنجامی ئەو کەسانەی لەگەڵ ئاوێهانەوە بەدەسـت دا ڕاهـاتوون، تـادوای ژیـانی هاوسـەرێتیش لـەڕێگای ئاوهێنانـەوە، بەدەسـت چـێژ وەردەگرن.

-جار هەیە هاوسەر سروشتی نیە بۆ کرداری جنـسی، بۆیـە پەنادەباتـە

(13).هـ. س

بەر ئاو هێنانەوە بەدەست.

-جار هەیە پیاو لەبەر چەند هۆکارێکی دەروونیو فسیۆلۆجی، چارەی ژنەکەی ناویٚو لەبەری رادەکاتو پەنادەباتە بەر ئاو هێنانەوە بە دەست.

-جار هەیە پیاو ژنەکەی ناگەیێنێتە چێژ (اللذة-ئۆرگازم) دوای ئەوەی خۆی پێی گەیشت، گوێ بە ژنەکەی نادات.

-جار هەیە ئەو کەسە بەهاوسەرێك ناگاتە تێری جنسی، پەنا دەباتە بەر ئاوهێنانەوە بەدەست.

-پیاو حەزی لەهەموو جۆرێتی یە، زۆر لە ژنان هیچ لەم رۆشن بیرییە تێناگەن، بۆیە پیاوەکە واز لە کردارە دێنیٚو بیر لە ئاو هێنانەوە بەدەست دەکات (١٤).

ئیسلام ئەم هۆکارانەی هەموو چارەسەر کردووە وەکو خۆپاراستن لە نەزەرو تەماشا کردنی حەرام، لە ڕێگای تێکەڵاویو سەیرکردنی فیلمو وێنەی رووتو گوێ گرتن لە گۆرانیو دەنگی حەرامو خۆپاراستن لە خەیاڵی سێکسی. پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ﴿کتب علی ابن آدم نصیبه من الزنا فهو مدرك لا محالة، العینان زناهما النظر، الاذنان زاناهما السماع واللسان زناها الکلام، والید زنا ها البطش، والرجل

---

([14]) ه. س. پ

زناها الخطى، والقلب يهوى ويتمنى، ويصدق ذلك الفرج او يكذبه﴾[١٥].

لێرەدا پێغەمبەر، ئاماژە بــە کاریگــەری تەماشــاکردن‌و بیــستن‌و، وتەوزمان‌و دەست وپێ‌و دڵ‌و ئەندێشە دەکات بۆ وروژاندنی جنسی، کــە سەردەکێشێ بۆ لادانە جنسی یەکان‌و داوێن پیسی.

داوا لە لاوان دەکات بەرۆژی بن‌و نوێژ بکەن: بوخاری گێراویەوە:

﴿ یا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج فانه أغـض للبصرواحصن للفرج، فان لم يستطيع فعليه بالصوم فان له وجاء﴾.

بێگومان ڕۆژوو نوێژ لە فــشاری جنــسی کــەم دەکەنــەوە، چــونکە خۆراك‌و تێری کەم، بیرو خەیاڵ لەسەر جنس کــەم دەکەنــەوەو، ویــست‌و ئیرادەی بەهێز دەکەن‌و، تەقواو چاودێری خوایی زۆرتر دەکەن.

خۆپاراستن لە نــەزەرو خۆپاراســتن لــە چــەوری بەتایبــەتی ئێــواران ورورژان کەمتر دەکات، بەڵام خواردنەوەی شیرو خــواردنی میــوە هێــوری دەکاتــەوە، یــان (کــافور) خــواردنی زۆر باشــە دیــسان نوســتن لەســەر کەلەکەی راســت لــە فــشاری جنــسی کــەم دەکاتــەوە، شــەیتانی بــوون بەتایبەتی لەکاتی نوستن لەسەر سك ڕوودەدات.

وەپێویــستە هەمیشە ئافرەت‌و مێرد خۆیان بۆ یەکتری جوان بکــەن و ژن لە هەموو کاتێکدا وەڵامی پیاو بداتــەوە، پیــاویش دەســت بــازی

---

([15]) متفق عليه

لەگەڵ ژندا بکاتو پەلە نەکات تا ئەویش دەگەینێتە چێژ. (جابر بن عبدالله) دەڵێ: ﴿نهى عن المواقعة قبل المداعبة ﴾[١٦],

واتە: پێغەمبەر (ص) قەدەغەی کردووە کرداری جنسی بەر لە دەست بازیو ماچ ئەنجام بدرێت، چونکە ژنان بە دەست لێدانو ماچ جنسی یان دەورووژێتو ئەویش دەگاتە چێژ، ئەنجامدانی زێ تەڕدەکاتو بۆ کرداری جنسی ئاسانکاری دەکات.

ئەنجا ئیسلام ڕێگای داوە بەهەموو شێوەکانی کرداری جووت بوون، مادام بە زێیەوە بێ. : ﴿نساءكم حرث لكم فأتوا حرثكم انى شئتم﴾ .

واتە: ژنەکانتان کێڵگەیێکن بۆ ئێوە، چۆنتان دەوێ بچنە لای کێڵگەتان.

پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی﴿إذا باتت المرأة هاجرة فراش زوجها، لعنتها الملائكة حتى تصبح ﴾[١٧], واتە هەر ژنێ سەر جێگای مێردی چۆل بکات تا بەیانی فریشتە نەفرینی لێ دەکەن.

بەو پێیە کرداری جنسی سەرکەوتوو تەوافوقی جنسی لە نێوان ژنو مێرددا لادانە جنسی یەکانو ناپاکی هاوسەری بنەبڕ دەکات.

---

([16]). الجامع الصغير للسيوطي، صحيح، رواه الخطيب

([17]).متفق عليه

(د. عبدالحسين بيرم ) دەنووسێ:

زانای دەروونی (برجر) دەڵێ: (٩٠٪ی خەڵکی لە هەندێ دۆخدا پەنا دەبەنەبەر ئاو هێناوە بە دەستو (٦٠٪)ی ژنانو (٩٠٪) پیاوان ئەنجامی دەدەن.

کێشەی ئاو هێنانەوە پەدەست ئەوەیە، زۆر کەس لێ ی بێ ئاگانو زۆر کەسیش بە هەڵە چارەی دەکەن، ئەوەی راستی بێ شەیتانی بوون بەر لە هاوسەرگیری قەربووکردنەوەی وزەی جنسی قەتیس بووە. ئاو هێنانەوە بە دەست ئەندامی چوك رەق ناکاتو قەبارەی گەورە ناکات، وەکو هەندێ کەس وا تێ گەیشتووە!، ئەندامانی جنسی لەرادەی سروشتی خۆیان زیاد ناکەن.

ئاو هێنانەوە بە دەست زیان بە دەمارەکانی زاوزێ دەگەیێنێت، چونکە ماوەیێکی دەوێ تا چالاکی دەست پێ بکاتەوە.

بۆیە نابێ هەفتەی لەیەك جار زیاتر ئاو بەدەست بێنرێتەوە، ئەوە ماندوبوونەی تووشی ئەو کەسەی دەبێ کە دوو جار ئاوی خۆی دێنێتەوە هەندی ماندووبوونی کەسێکە (٩) میل بڕوات، بەڵام یەك ئاوهێنانەوە بەئەندازەی رۆیشتن یەك میل ماندوودەکات.

ئاو هێنانەوە بەدەست کۆئەندامی دەمار ماندوو دەکات، چونکە خەیاڵو ئەندێشە بۆ دروست کردنی خەیاڵی جنسی بەکار دەهێنرێت.

بەلاّم لەکرداری جنسی شەرعی دا ئەم جۆرە ماندوو بوونە نییە!.

هەروەها دەنووسیّ:

(١-هەستە دەمارە جنسییەکان پەك دەخات، چونکە رایان دیّنیّ بۆ ئاو هیّنانەوە بە دەست بە هەمیشەیی.

٢-ئاوهیّنانەوە بە دەست تیّنوەتی جنسی زۆرتر دەکاتو نایشکیّنیّ، پیّچەوانەی کرداری جنسی ژنو میّرد، چونکە جووت بوونی ژنو میّرد خود بەخشیە، ملکەچی یەکە لاویّتی بە ناموّسو شەرەفەوە دەگیّڕیّتەوە، لەم دۆخەدا نەك هەر کۆندامی زاوزیّ بەلّکو هەموو ئەندامەکانی لە شو دەروون بەشداری تیّیدا دەکەن.

٣-ئاو هیّنانەوە زاکیرە ماندوو دەکاتو پەرتو بلاّو شپرزەی دەکات.

٤-خەمو پەژارەوە دلّەڕاوکی دەهیّنیّت.

٥-ئاو هیّنانەوە بەدەست دۆخیّکی ناسروشتی یە، خۆپاراستنیش لە باری سروشتی شتیّکی راستە. بۆیە ئامۆژگاریان ئەوە یە کە دەست لەو کارە هەلّگریّو خۆ خەریکی خولیای تریکریّ وەکو وەرزشو ویّنە کیّشانو پەیکەرتاشیو خویّندنەوەو کارکردن، هەموو ئەوانە بیرکردنەوە لە م کردارەکەم دەکەنەوە، هەلّی زیاتر دەدەن بۆ هاوسەرگیری، کە تاکە ڕیّگای دروستە، متمانە بە خۆدەکاتە پیّشەنگی سەرەکی بۆ پاراستنی جۆرو ژیانیّکی کۆمەلاّیەتی کامەرانی دوور لەپەژارە.

کرداری وەرزشو خولیاییەکان بەشیّکی زۆر لە وزەی سیّکسی کپ

بوو و قەتیس کراو وزەی جەستەیی دەمژێتو چارەسەرە بۆ ئاو هێنانەوە لە لاواندا) [١٨].

لە فەرموودەدا هاتووە: ﴿علموا ابناءكم السباحة والرماية والمرأة المغزل﴾[١٩].

واتە: منداڵەکانتان فێری مەلەوانیو هاوێشتن بکەن، ژنان فێری رستن بکەن. وەهاتووە. ﴿مروا اولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين، واضربوهم عليها وهم ابناء عشر سنين، وفرقوا بينهم في المضاجع﴾[٢٠].

واتە: فەرمان بە منداڵەکنتان بکەن بە نوێژ لە (٧) ساڵەدا، لە (١٠) ساڵیدا لێیان بدەنو ، سەرجێگایان بۆ جیابکەنەوە باپێکەوە نەخەون).

(د. فریدیك کیهن) دەنووسێ: (ئەو گەنجەی رۆژانە نوێژێکی دروست دەکات، بەشێ لە ئارەزووی جنسی دەگۆڕێن نوێژو بیرکردنەوە لە جنس ئارادەیێك کەم دەکاتەوە) [٢١].

(ئەو منداڵەی ساغە لە جەستەدا وپەروەدەی جوانی کراوە بەر لە (١٠) ساڵی هیچ لە ئارەزووی جنسی نازانێت)[٢٢].

---

(18). الجنس، د. عبدالحسن بهم / ل:١٤٩-١٥٤، به کورت کردنەوە.

(19). رواه البيهقي والفردوسي، رواه ابو داود

(20). رواه ابو داود حياتنا الجنسية / ل: ٣٨٧

(21). رواه ابو داود حياتنا الجنسية / ل ٢٩٨.

(22). رواه ابو داود حياتنا الجنسية / ل. ٦١.

بەڵێ رۆشنبیری جنسیو نوێژو ڕۆژوو، وەرزشو کارو خوێندنـەوەو جیاکردنەوەی ژوور بۆ کچانو کوڕانو جیاکردنەوەی جێگا بۆ منداڵان بۆ نوستنو پاراستنی منداڵ لە سـەیرکردنی وێنـەو فیلمـی رووتو هـەموو ئەوانە منداڵ لە زوپیێ گەیـشتن دەپـارێزیو، لاوان لەلادانـە جنـسیەکان دەپارێزێت، لەوانە ئاو هێنانەوە.

دیسان ئاو هێنانەوە بە دەست سەر دەکێشێ بۆ زۆر ئاو هێنانـەوە، چونکە ئەو کەسەی خووی پێوە دەگرێ زۆر دووبارەی دەکاتـەوە، لەبـەر ئەوەی تێنوەتی جنسی ناشکێنێت.

(زۆر ئاو هێنانەوە بەکرداری جنسی زیانەکەی ئاشکرا بـە لـەش و خانەی مێشکی دەدات، سەرباری لە دەستدانی ماددەی زیندەگی لە لـە شدا)[٢٣].

زۆر دوعا هەیە وەکو تێفرۆسماندنێ کـار لـە نەسـتی (اللاشـعور) دەکەنو لە توانای جنسی کەم دەکەنەوە، وەکو ﴿اللهم إني أسألك الهدى والعفاف والغنى﴾ , دیسان خوێندنی قورئانو و یادی خـوداو سـەڵەوات هەموو ئەوانە بەرگری بە دەروون دەدەن بۆ پاراستن لە فـشاری جنـسیو نەزەرو تەمەشا کردنو لادانە سێکسی یەکان

(الاستاذ الدکتور: عبدالخالق حسين یونس) دەنوسێ

---

([23]) الانحرافات الجنسـية/ ل٦١.

(ئاو هێنانەوە نەخۆشی پرۆستات دروست دەكات).

(بەڵێ : دووبارەكردنەوەی ئاو هێنانەوە سەر دەكێشێ بۆ خوێن تێزانی زۆر لە پرۆستاتدا، پاشان ئەو خوێن تێزانە (الاحتقان) هەو (التهاب) دروست دەكات، هەوەكەش ئەگەر زوو فریای نەكەوێت هەوی توندو درێژ خایەن پەیدادەكات، فریاكەوتنەكەش سەردانی پزیشكی پسپۆرە بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاریو چارەسەر.

دیسان ئاو هێنانەوە بە دەست كاریگەری لاوەكی بۆ سەر پرۆستات دروست دەكات وەكو: (خوێن تێ زان لە پرۆستاتو هەوی تیژو درێژخایەن لەپرۆستاتداو، كەمی شلەی تۆوی كە پرۆستات دەیرێژێ، لینجی زیاتر لە لینجی ئاسایی‌و، سكالاكردن لە زوو ئاو هاتنەوە یان درەنگ ئاو هاتنەوەو درەنگ منداڵ بوون یان نەزۆكی، هەندێ جار لاوازی جنسی دروست دەكات). (دیسان ئاو هێنانەوە بەدەستو دووبارە كردنەوەی كێشە لە (چیكڵدانۆچكە تۆوییەكاندا (الحويصلات المنوية) دروست دەكاتو خوێنیان تێ دەخزێت.

(هەمیسان ئاو هێنانەوە شوێنەواری لاوەكی پەیدا دەكات لەسەر چیكڵدانۆچكە تۆوییەكان، لە گەڵ زۆر خوێن تێزان هەو دروست دەكات، كە سپێرم دروست دەكاتو ئازار لە كاتی ئاو هاتنەوەدا پەیدا دەكات).

[redacted]

## زیانەکانی ئاوهێنانەوە بە دەستپەڕ لە هاوسەرگیری

١-لەکاتی ئەم کردارە دەکات هەست بە ماندووبوون دەکات، بەتایبەتی لەکاتی زیادەڕویدا.

٢-خوێن خزانە ناو کۆ ئەندامی زاوزێ، بەتایبەتی لەگەڵ قەدەغـەکردنی دەرچوونی تۆوەکەدا!!.

٣-دروست کردنی هەوی تیژو درێژ خایەن لەپرۆستاتدا.

٤-هەوی تیژو درێژ خایەن لە سیکلّدانۆچەکەی تۆویدا.

٥-هەوی تیژو درێژخایەن لە جۆگەلەی دەرهاویشتندا (القناة القاذفة).

٦-ئاو هاتنەوە لەخۆوە.

٧-زوو ئاو هاتنەوە (سرعة ا لقذف)و لاوازکردنیو رەق بوونی چۆك.

٨-کەم کردنەوەی قەبارە شلەی تۆوی دەرچوو.

٩-ئازار لەکاتی ئاو هاتنەوەدا.

١٠- خورانی چوكو کۆ ئەندامی زاوزێ.

١١-خوێن هاتن لە چوکەوە بەتایبەتی لەکاتی زۆر ئاو هێنانەوەدا.

١٢-هەوی دووبارە لە کۆئەندامی میزو زاوزێ دا.

١٣-هەست کردن بە دڵـە ڕاوکـێو تـرس لـە توانـای جنـسی لـە دوای هاوسەرگیری دا.

١٤-هەست کردن  بە تاوانو ترس لەخودا لەسەرپێچی کردن.

## "دوای هاوسەرگیری"

١-هەست بە دڵە راوکێو شێوان لەگەڵ زوو ئاو هاتنەوەدا.

٢-پرۆستاتو سیکڵدانۆچکەی تۆوی توشی هەوی خوێن تێ زان دەبن.

٣-تووش هاتن بە لاوازی جنسی بەتایبەتی دەروونی.

٤- نەگەیشتن بە ئاستی تێربوون لەگەڵ هاوسەردا.

٥-بەردەوامی ئاوهێنانەوە، دوای هاوسەرگیریش وەکو لای زۆر کەس بینراوە.

٦-سەرنەکەوتنی هاوسەرگیری، گەر نەیتوانی لەرووی جنسی یەوە بەختەوەری بکات.

٧-ئازاری زۆر لەکاتی ئاوهاتنەوەدا.

٨-دووبارەبوونەوەی هەوی پرۆستاتو سیکڵدانۆچکەی تۆوی دەبێ بەهۆی: کەمی شلەی تۆوی‌و، زۆری لینجی یەکەی‌و، گیران لەئاستی کۆنەندامی زازوزێدا، وەکو ئالۆزە(ألبربخ)و بۆڕی گواستنەوە، ئەمانە نەزۆکی کاتی یان هەمیشەیی پێ پەیدا دەکەن.

## بۆ خۆپاراستن لە کاریگەریە لاوەکیەکانی ئاو هێنانەوە.

١-خۆپاراستن لە ئاو هێنانەوە.

٢-پەروەردەیی ئیسلامی جوان.

٣-گەنج دەست بەداوێن پاکی‌و هێز ی برواوەبگرێت.

٤-زوو ژن هێنان.

٥-ڕۆژوو گرتن.

٦- خۆپاراستن لە وروژێنەرە جنسییەکان [24]: بێگومان لەم چاخەدا خۆپاراستن لە ئاوهێنانەوە بەدەست زۆر گرنگە، چونکە وروژێنەرو جنسی یەکان لەماڵەوەو کۆڵانو بازاڕو قوتابخانەو زانکۆ سەتەلایتو تەلەفزیۆنو هەموو تۆڕەکانی ڕاگەیاندنی گرتۆتەوە، کە لاوان هاندەدەن بۆ لادانە جنسی یەکان، لەوانە هێنانەوە بە دەست.

پاشان ئەوانەی ئاو بەدەست دێنەوە بۆ چێژی زیاتر پەنا دەبەنە بەر لادانی تری جنسی، وەکو (فتشیی یە) وەکو دەست لێ دانو بەکارهێنانی جلو بەرگو پێلاوو گۆرەوی شتی تری ژنان. یان پەنا دەباتە بەر سەرتاتکی کردن (الاستراقية voyeurism) بۆ سەیر کردنی کەسێکی ڕووت یان هەڵدەستی بە خۆ ڕووت کردنەوە. یان یەخەی ژنان دەگرێ کە بە (التحرشية frotteurism) ناسراوە، پیاوان پێوەی هەڵدەستن و لە شوێنە قەرەباڵغەکانی وەکو شەمەندەفەرو سینەماکانو ئاهەنگەکانو بازاڕ کۆڕی تێکەڵ خۆیان لە ژنان دەخشێنن، بەمەبەستی

[24]).بڕوانە : (البروستاته/ د. عبدالخالق حسن يونس/ ل: ٥٣/ ٥٥ ڕێنومایی سێکسی ئیسلامی، هی نووسەرو چاپکراوە هەروەها (جنس لە ژیانی هەموو کەسێکدا لەژێر چاپدایە، (فەلسەفەی بالاٌ پۆشین) لەئیسلامدا، لە ژێر چاپدایە.

گەیشتن بە چێژی جنسی. هەموو ئەوانە بەشێکن لە ناوهێنانەوە. بۆیە ئیسلام تێکەڵاوی ژن و پیاوی قەدەغە کردووە. بۆ زانستی پتر بڕوانە (الجنس والنفس/ د. علی کمال / ل٢١٥-٢١١).

(تۆلستۆی) دەڵێ: (تا خۆم دورخستبی لە کرداری جنسی بۆ ماوەیێکی درێژ چالاکی نائاسایی دەچووە ناو دەمارەکانەوە، هەستم دەکرد بە لێشاوی خوێنێکی نوێ دەڕژێتە ناو ویستمەوە. من بەم ویستە زۆرە لە توانامدایە کاری موعجیزەیی دروست بکەم) [٢٥].

بەڵێ تۆو زۆر زۆر گرنگە چونکە زۆر ماددەی زیندەگی تێدایە وەکو (سۆدیۆم پۆتاسیۆم و زنك و سترات و کلۆر و فۆسفات و ئازوت و فرکتۆز و شتی تر) کە لە کردنەوەی لە لەش دا وزەی زیندەگی گیانی و جەستەیی کەم دەکاتەوە.

توانای زیرەکی و دەرخ کردن کەم دەکاتەوە، توانای رامان لاواز دەکات، وەك (عبدالله حمدان) لە (العادە السریە/ ل: ٧٩) دا روونی کردۆتەوە.

مامۆستای دکتۆر: (Lasegue) لە کتێبەکەیدا (مقبرة الرجال) باس لەخراپیەکانی داوێن پیسی دەکات لە راست هزرو زانست کە لە رێسا گشتی یەکانن: ئەگەر ئێمە لەو لاوازانە وردبینەوە کە مل بۆ ئاو هێنانەوە کەچ دەکەن و لەرووی مێشکەوە لێیان بڕوانین، دەبینین هزریان

(٢٥) الانحرافات الجنسیة . ل:٧٩/٧٧.

[redacted]

کەمەو لە خوارناوەراستی پلەی برادەرەکانیانەوەن‌و دەبێنن نەتوانن بگەنە ئاستی بەرزی کۆمەڵایەتی)[٢٦].

بێگومان ئاو هێنانەوە بەدەست‌و سەیرکردن بە ناپاکییەوە، هەموو ئەو لادانە جنسی یانە لەهزرو زاکیرە کەم دەکەنەوە، فوتابی یان لە دەرخ کردنی وانەکان‌و تێگەیشتنیان بێ تاقەت دەکات، تا لەکاتی دەچنە سەر کارو بارەکانیان لەبەربێ تاقەتی دەروونی‌و جەستەیی ناتوانن وەکو پێویست کارەکانیان رابپەڕێنن. بۆیە ئیمرۆ بە هۆی بەرەڵایی جنسی‌و لادانە جنسی یەکان ئاستی زانستی دواکەوتووە بەرهەم هێنان کەم بۆتەوە، خراپەکاری هەموو لایەنێکی گرتۆتەوە.

دیسان ئاستی ویلایەت‌و کەرامەت‌و سۆفیگەری کەم کردۆتەوە کاری لە رامان (التصور)و هاڵەی موگناتیسی‌و نورکردووە.

(د. جۆرج سریلد) دەڵێ: (ئەو بەستەزمانانەی کزیلەی ئاو هێنانەوە بەدەست توانای جەستەیی‌و ئەدەبی لە دەست دەدەن، بە کەڵکی هیچ شتێ نایەن‌و شایانی خۆماندووکردن‌و چێژ وەرگرتن نین، ئەوان بێزار دەبن‌و کات لە گەمەو گاڵتەو گەپدا خەرج دەکەن، زۆری دەکەونە ناو کاری بێ شەرمانە.

(Martegazza) دەڵێ: (پیاوان‌و لاوان دەتوانن داوێن پاکی تاقی بکەنەوە، دەبینین زاکیرەیان خێرو سفتەو بیرەکەیان زیندوو پەیتەر

---

(26) هـ.س.

ویستیان چالاکەو بەورەیە، پێچەوانەی ئەوانەی لە کاری جنسی دا تا بێ تاقەت بوون زیادە رەوی لە جنس دادەکەن، ئەوانە ئەم سیفەتە جوان چاکە نیان نییە) (٢٧).

پاشان ئەوانەی ئاو بە دەست دێننەوە لەئاستی شەرمو ئابڕویان کەم دەبێتەوەو وردە وردە ئاکارە جوانەکان لەدەست دەدەن. دەبینین زۆر سەیر دەکاتو بە شوێن شەرمگەی ژناندا دەگەڕێ، ناپاکی دڵو چاو لەگەڵ هاوسێکانی دا دەکات، هەروەها ها لە بازارەکاندا شوێن ژنانو کچان دەکەوێ، هەمیسان لە قوتابخانەداو، لە شوێنە گشتی یەکاندا یەخەیان دەگرێت، لەماڵەوە هەر خەریکی کەناڵە سێکسی یەکانو فیلمو گۆرانیە خۆشەویستی یەکانەو هەموو بیرو هزرەکی لای جنسیەو تەواوی چالاکی یەکان لەدەست دەدات، تا خواپەرستی یەکان واز لێ دێنێ، یان بە تەمبەڵی ئەنجام یان دەدات.

هەمیشە کێشەو هەرا لە ماڵ دا دەنێتەوەو بەتەواوی شیرازەی لە گەڵ ئەندامانی خێزانی دا تێك دەدات.

وە شەهوەت رێگایێکە شەیتان لە رێگایەوە مرۆڤ بەرەو هەڵدێر دەباتو لەرێگای وەسوەسەکانیەوە شەهوەتی شیرین دەکاتو هانی دەدات بۆ شوێن کەوتنی و بێ دڵی نەکردنی.

خودا دەفەرمووێ ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا

(27) هـ. س

الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ﴾[٢٨] خودا دەفەرمووێ:﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ﴾[٢٩].

شەیتانو هاوڕێی خراپو نەفس هەموو ئەوانە هاندەرێکن بۆ دروست کردنی دالْغەو خەیالْی بەد لە نەفسداو هاندەرێکن بۆ شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوویەکان باشترین چارەسەریش داوێن پاکی یە، زوو ژن هێنانو زوو شووکردنە.

## داوێن پاکی (العفة)

پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾[٣٠].

واتە: ئەوانەی ژنیان دەست ناکەوێ با داوێن پاکی بکەن، تا خودا لەسایەی خۆیەوە دەوڵەمەندیان دەکات.

(د. فریدریك کیهن) دەڵێ:

(داوێن پاکی لە رووی تیۆرییەوە باشترین چارەیە بۆ چارەسەری ئەو کێشانەی هەڕەشەی لە بێ ژنەکان (العزاب) دەکات) [٣١].

(د. هافیوك ئەلیس)و (د. ڤان دی فیلد) باس لە داوێن پاکی

---

([28]).سورة مريم، الاية ٥٩.

([29]). سورة البقرة، الاية ٢٦٨.

([30]).سورة النور، الاية ٣٣.

([31]).حياتنا الجنسية، ل: ٣٣٣.

دەکـەن، کـە کاردەکاتـە سـەر تەندروسـتی گـشتی تـاك بەگـشتیو تەندروستی جنسی بەتایبەتی. بەم مەرجـەی ئەندامـەکانی لەشـی ئـەو کەسە ساغ بێ.

دووەم: بڕوایاو وابێ زیانی بۆ تەندروستی یان نابێ، چونکە ئیحـای زاتیو تێفرسماندن لەم دۆخـەدا ڕۆڵێکـی بـاڵای دەبێـت، نـابێ بـیر لـە مەسـەلەی مەترسـی یـەکان بکاتـەوە، ئـەنجا پێویـستە لەگـەڵ داوێـن پاکییەکـەدا لـە هـەواییەکی خـاوێن دا بـژی، وەرزشو مەلـە بکـات، هەروەها هۆکاری تر کە کاربۆ چالاککردنی تەندروستی گـشتی دەکـەن، چونکە مرۆڤی بەهێز ویستی بەهێزە، کار لە شەهوەتی خـۆی دەکـات، ئەنجا نابێ بابای داوێن پاك ماددە کهولیەکان بخواتەوە وەکـو شـەرابو جۆرەکانی، نابێ زۆر گۆشت بخوات،..... بۆ زانستی پتر بروانە (الـدوافع والقوة الجنسية)[٣٢].

بەکورتی باشترین چارەسەر بۆ کێشەی سێکسی لاوانو هەرزەکاران لـەئاین و زانـستی پزیـشکی دا داوێـن پـاکی یـە، کـەلاو لـە لادانـە جنسییەکانو داوێن پیسی یەکان دەپارێزێتو ژیانی تاكو کۆمەڵگا لـە مەترسی یەکانی لادانە سێکسیەکانو داوێن پیسی رزگار دەکات، چاوی لاوان داوێن پاکی یەکی تەمەن کورتە، کەسەر بکێشێ بۆ هاوسـەرگیری یەکی بەزوویی، هەموو ئەزموونەکان ئەوەیان سەلماندووە خێـزان لەسـەر

---

([32]).الدوافع والقوة الجنسية، ل. ١١٣-١١٧.

بنەمای هاوسەرگیری شەرعی دامەزراوە لەهەموو سیستەمێکی تر دروستی ترو باشترە، بۆیە ئیسلامیش ئەوەی هەڵبژاردووە.

## هاوسەرگیری

﴿یا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج فانه اغض للبصر واحصن للفرج.... ﴾رواه البخاري,

واتە: ئەی پێری لاوان کێ لەئێوە توانی با ژن بێنێ، ئەوە باشترین رێگایە بۆ چاو پاراستنو داوێن پاکی کردن.

(د. فریدریك کهن) دەڵێ: داوێن پاکی سوود بە لاوان دەگەیەنێت لە روانگەی رەوشتی یەوە، نەك لە روانگەی عەمبارکردنی تۆوەکانەوە، ژیانی جنسیو ئاو هێنانەوە بە دەست دەمارەکان دادەهێزرێنێ، بەلام داوێن پاکی هەستی دەروونی زیاد دەکاتو رەویشت بەهێز دەکات [33].

هەروەها دەڵێ: (بەلام بێ ژنی بەردەوام گلاندی زاووزێ پەك دەخات، رژانی هۆرمۆنیی بۆ ناو خوێن کەم دەکاتەوە، چەندساڵی داوێن پاکیو سەڵتی بەس نیە بۆ لاوازکردنی وتەکان، چونکە تەواوی لەشمان بەرگری هەیە، گەر سست بوو مانای وانیە تا سەر وەستاوە، بەلام بێ هاوسەریو سەڵتی بۆ ماوەیێکی درێژ نەك هەر وەتەکان لاواز دەکات، بەڵکو سروشتەکانی جنسیش لای پیاوو ئافرەتیش خامۆش

---

([33]). حیاتنا الجنسیة، ل ٣٣٥.

دەکات، گەر پیاو دەوام بکات لـە سـەڵتی دا خەسـیوو دەبـیٚو ژنـیش دەبێتە نموونیەك بۆ ژنانی (العوانس)[٣٤].

هـەروەها دەڵـی : ( خـەڵکی لـە رابـردوو دا زوو ژنیـان دەهێنـا، ئەمەش چارەیێکی دروست بـوو بـۆ کێـشەی سێکـسی، بـەڵام ئـەمڕۆ ئەمەنی هاوسەرگیری دوا دەکەوێت)[٣٥].

بێگومان سێکس دوای خواردنو گەورەترینو قوڵترین غەریزە دێ، گەر مرۆڤ کپی بکات توشی زۆر دڵەڕاوکێو قەیران دێ، گەر بەرەڵاشـی بکات هەروەها، بۆیە هاوسەرگیری شەرعی تاکە رێگای سروشتی یە بـۆ وەڵام دانەوەی ئەو غەریزەیە، کە دەروون دادەمرکێنێو لـەش لـە تێـك چوون دەرباز دەکاتو هاوسەنگی رادەگرێت.

جنس بەشێکە لە ژیان، گـەر ژیـان سێکـسی تێدانـەبێ قـڕی تـێ دەکەوێت، گەر جنس کپ بکرێ یان بەڕەڵا بکرێ لەهەردوولادا زیانی بۆ سەر تاكو کۆمەڵگا دەبێت، بەڵام هاوسەرگیری تاکە رێگای سـاغە بـۆ پاراستنی مرۆڤ لـە کـپ کـردنو بـەرەڵا کردنـی جنـسیو کارەسـاتو مەترسی یەکانیان.

هەروەها هاوسەرگیری ژنانیش دەپارێزێ لـە داوێـن پیـسی یـەکانو لادانە جنسی یەکان، لەوانە ناو هێنانەوە، بەدەست یان بەهەر شـتێکی

---

(34).هەمان سەرچاوە، ل ٣٣٥

(35).هەمان سەرچاوە ، ل ٣٨٧.

تر، چونکە ناو هێنانەوە بۆ ژنان، وەکو باسکرا مەترسی یەکانی بۆ ئەوان پترە نەك بۆ پیاوان لەوانە:

(هەو لە زێو حەوزو منداڵدانـدا دروست دەکات، هەو لەبۆڕی میزدا دروست دەکاتو گورچیلە رادەگرێت، تەنینەوەی کەڕوویی و بەکتریای و ڤایرۆسی لە زێو ئەندامانی زاووزێ دا دروست دەکاتو دەگاتە جۆگەلەی فالۆبو هەندێ جار بۆڕیەکان دەگرێو دوای هاوسەرگیری نەزۆکی دروست دەکات، سەرباری ساردی جنسی و ماکی دەروونی و دەماری....دواتر سەر دەکێشێ بۆ لادانە جنسیەکانی ترو داوێن پیسی...)(٣٦).

پێویستە لاوان نەترسن بڵێن: ژنمان بۆ نایەت، پارەمان نییە، کارمان نییە، پێمان بە خێو نابێت، خانوومان نیە، خانومان بۆ بەکرێ ناگیرێت، پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: ﴿ثلاثة حق على الله عونهم، المجاهدين في سبيل الله، المكاتب الذي يرد الاداء، والناكح الذي يريد العفاف﴾(٣٧).

واتە : سێ کەس حەقە بەسەر خواوە یارمەتیان بدات، خەباتگێڕ لە ڕێگای خودا، ئەو کۆیلەی دەیەوێ پارەی خۆکرینەوە بدات، ئەو گەنجەی دەیەوێ ژن بێنی بەمەبەستی داوێن پاکی. ئافرەتانیش پێویستە

---

(36). الموسوعة الجنسية للازواج، د. سليم عبدالله رمال. ل: ١٨٨ سەیرکە.

(37).رواه الترمذي

مارەیی خۆیان کەم بکەنەوە، داوای مارەیی زۆرو خانووی سەربە خۆو، ناومالّی تازەو ..هتد نەکەن، بەختەوەری هاوسەری لەوەدایە کە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: ﴿ إن أعظم النكاح بركة أيسره مؤنة ﴾[٣٨].

واتە: زۆرترین فەر لەمارەکردندا لەوەدایە کە مترین مارەیی تێدایە.

جنس غەریزەیێکە لە ژیانی مرۆڤدا گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، هەر یەکە لەژنانو پیاوان پێویستی جنسی یان هەیە پێویستە لە هاوسەرگیری دا وەلام بدرێتەوە، لەژیانی هاوسەرگیری دا جەستەی یەکتریان بۆ رەوادەبێ تاچێژی جنسی لێ وەرناگرن، کە لای خودا حەلال کراوە، تاکە رێگای دروستو شەرعی یە بۆ وەلامدانەوەی بۆ خۆپاراستن لە کپ کردنی جنسیو لادانە جنسی یەکانو کارە بەدرەوشتی یەکان.

ئاوهێنانەوە بەدەست کاتێ حەلال دەبێ، کە دەسەلاتت لە دەست داوەو خەریکە تووشی زینا دەبیت، کە تاوانێکی گەورترەو مەترسی زیاترەو وەکو تووش هاتن بەنەخۆشیە جنسییەکان.

(د. عبدالخالق حسن) دەلێ : (ژمارەی نەخۆشیە جنسیەکان کە بەهۆی لادانە جنسی یەکان دەگوازرێتەوە زیاتر لە (٢٥) نەخۆشیە کە ئەندامانی جنسی لەناو دەبەن بەتایبەتیو ئەندامانی لەش بەگشتی).

---

([38]).رواه احمد

هەر لەساڵی ١٩٨٠ وە تا (کۆتایی) ٢٠٠٢ز زیاتر لە (٢٥) ملیۆن کەس بە پەتای ئایدز مردوونو (١٥) ملیۆن منداڵ هەتیو بوونو (٤٥) ملیۆن کەس توشی هاتوونو رۆژانە (١٦) هەزار کەس لە جیهاندا توشی دەبن. ئەم نەخۆشیانە نەك هەر گوندو شارو وڵاتو کیشوەرێك لەناو دەبەن، بەڵکو گەورەترین زیان لەهەموو جیهان دەدەن، لە زیانی گیانیو ئابووریو ئاسایشی. باشترین چارەش داوێن پاکیو هاوسەرگیری شەرعییە، واز هێنانە لە ودانە جنسی یەکان، کە ئیسلام دایناوەو، تۆ بەو گەڕانەوەیە بەرەو خودا، گەر سزای دنیا ئاوابێ، ئەی دەبێ سزای رۆژی دوایی چۆن بێ، خوایە ئامان بدات ؟!

﴿والذين لايدعون مع الله إله آخر ولا يقتلون النفس التي حرم الله الا بالحق ولايزنون ومن يفعل ذلك يلق اثاما، يضاعف لە العذاب يوم القيامة ويخلد فيها مهانا، الا من تاب وآمن وعمل صالحا.... ﴾[٣٩] ، شایانی باسە (ناكح اليد) لە مەزهەبی شیعە نەفرین لێ کراوە (ناكح اليد ملعون)[٤٠]، خوا پەنامان بدات.

بۆ خۆپاراستن لەم دیاردانە پێویستە لاوانمان رۆشنبیر بکەینو بتوانین ئامادەیان بکەین بۆ ئەو قۆناغە مەترسیدارە، کەهەرزەکاریو

---

([39] ).الشاكل الجنسية، ل: ١٦، د. عبدالخالق حسن.

([40] ).العادة اليسرية. ل٨٣.

بالغی یه، چونکه لەم قۆناغەدا چەند گۆڕانی دەروونیو جنسیو فیسیۆلۆجیو روالەتی دروست دەبێت. گەر رۆشبیربکرێن تا بە دزیشەوە لادانە جنسی یەکان نەنجام نادەنو دەتوانن خۆیان لەبیرو دالغەو کرداری هەڵە بپارێزن، چونکە ئەم کارانەیان بەلاوە گوناهو بێ شەرمیو بەدرەوشتی دەبێت، پێ یان حەرام دەبێت، ئاشنا دەبن بە زیانەکانی یانو خۆیانی لێ دەپارێزن، تا ئەو کاتەی دەچنە قەفەزی زێڕینی هاوسەرگیریەوە، لەکۆتایی دا داواکارین لە خودا ﴿اللهم اني اسالك الهدى والتقى والعفاف والغنى﴾، پێویستە ئەمە نزای هەموو لاوێك بێو لەسایەی ئەم نزایە دا رۆشنبیریو وەربگریو پەروەردە بێت. ﴿وصلى الله على سيدنا محمد واله الطاهرين واصحابه وازواجه والناس أجمعين﴾.

**چیوەی سەرێ ، ٨/٩/ ٢٠٠٩**

## سەرچاوەکان

١-قورئانی پیرۆز
٢-تفسیر القرآن العظیم (ابن کثیر).
٣-العادة السرية، عبدالله حمدان.
٤-سن المراهقة، موريس دوبس، ت: سمير ارسلان.
٥-الفقه الاسلامي وادلته، د. وهبة الزحيلي.
٦-الجنس: د: عبدالحسين بيرم.
٧-الجنس والنفس، د. علي كمال.
٨-الموسوعة الطبية الفقهية، د. أحمد محمد كنعان.
٩-الانحرافات الجنسية، جمال صادق مردان.
١٠-حياتنا الجنسية، د. فريدريك كهن.
١١-البروستاتة، د. عبدالخالق حسن يونس.
١٢-الدوافع والقوة الجنسية، د. هافيلوك اليس، د. فان دي فيلد.
١٣-الموسوعة الجنسية للازواج، د. سليم عبدالله رمال.
١٤-المشاكل الجنسية، د. عبدالخالق حسن يونس.

ناوەڕۆك

هەردەم لەچاوەڕوانی بەرهەمی نوێ دابن..




دیارە زۆر شت هەن پێویستیان بە ڕوون کردنەوە هەیە بەتایبەتی لەنێو گەنجان و ئەوانەی بەژیانی هاوسەرگیری نەگەیشتوون، لەم کتێبەدا باسی ئەو حوکمە دەکات بۆ ئەو کارەی کەزۆر لەگەنجان پێوەی گیرۆدەن بۆ ئەوەی بزانن کە ئاینی ئیسلامی چ حکومێك و ڕێگای چارەی دانەوە تاکو بتوانن خۆیان لێی بپارێزن.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر